# کوشتنی مورتەد

نمونەیەکی تری بەناو قورئانیەکان و نەیارانی فەرموودە بۆ سەلماندنی ئەوەی گوایە ناکۆکی هەیە لەنێوان #قورئان و فەرموودە بریتیە لە کوشتنی مورتەد واتا ئەو کەسەی کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، کە ئەوەش بە قسەی ئەو کەسانە پێچەوانەی قورئانە چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ البقرة: 256 واتا: زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاك و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی.

فەرموودەکانی کوشتنی مورتەد:

1- "مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ" واتا هەر کەسێك ئاینەکەی گۆڕی بیکوژن.

ئەو فەرموودەیە لەزۆربەی کتێبەکانی فەرموودە هاتووە لە ابن عباس دەگێڕدرێتەوە، بوخاری بە هەردوو ژمارەی (3017، 6922) ریوایەتی کردووە، نەسائی لە چەند شوێنێك ریوایەتی کردووە بەژمارەکانی (3508 - 3514)، ترمزی (1458)، ئەبو داود (4351)، ابن ماجە (2535)، أحمد (1871، 2551، 2552، 2969، 22015)، ابن حبان (4475، 5606).. ئەوە بێجگە لە حاکم و بەیهەقی و صەنعانی و دارقطني و طەبەرانی و ابن أبی شیبە...

لێرە گومانێکی بەناو قورئانیەکان لەسەر ئەو فەرموودەیە ئەوەیە کە فەرموودەکە تەنها لە رێی عکرمە لە ابن عەباسەوە گێڕدراوەتەوە، وە دەڵێن کە عکرمە بریندار کراوەو جێی متمانە نیە لەلایەن زانایانی جەڕح و تەعدیل. لە وەڵامی ئەوەدا پێش ئەوەی بەرگری لە عکرمە بکەین پێویستە بڵێین کە راست نیە ئەو فەرموودەیە تەنها لە رێی عکرمە هاتبێ، بەڵکو نەسائی بە ژمارەی (3512) لە رێی حەسەنی کوڕی عەلی (خوا لێیان رازی بێ) دەیگێڕێتەوە، هەر نەسائی بە هەردوو ژمارەی (3513، 3514) لەرێی ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی رازی بێ) ئەویش لە ابن عباس ریوایەتی دەکا، ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا بە ژمارە (2966) بەهەمان شێوە لەرێی ئەنەس ریوایەتی دەکا، هەروەها بە ژمارە (22015) بەم شێوەیە ریوایەتی دەکا: عن أبي بردة، قال: قدم علي أبي موسي معاذ بن جبل، باليمن، فإذا رجل عنده، قال: ما هذا؟ قال: رجل كان يهوديا، فأسلم، ثم تهود، ونحن نريده علي الإسلام منذ، قال: أحسبه، شهرين. فقال: والله لا أقعد حتي تضربوا عنقه. فضربت عنقه، فقال: قضي الله ورسوله: «أن

**من رجع عن دينه فاقتلوه» أو قال: «من بدل دينه فاقتلوه"، واتا موعازی کوڕی جەبەل هاتە لای ئەبو موسای ئەشعەری پیاوێك لەلای بوو، پرسیاری کرد ئەوە چیە؟ وتیان پیاوێکە پێشتر جولەکە بوو بووە موسڵمان ئێستا بووەتەوە جولەکە، ئێمەش بانگی دەکەینەوە بۆ ئیسلام ماوەی وای بۆچووم دوو مانگە، موعاز وتی: سوێند بەخوا دانانیشم تا لەسەری نەدەن، ئینجا لەسەریان دا، پاشان موعاز وتی: خواو پێغەمبەرەکەی حوکمیان داوە کە هەر کەسێ: لە ئاینەکەی گەڕایەوە یا گوڕی ئەوا بیکوژن. کەواتە ئەو ریوایەتە تەنانەت لەڕێی ابن عباسیش نیە بەڵکو لە ڕێی موعازی کوڕی جەبەل هاتووە. ابن حبانیش بە ژمارەی (4475) هەر لە ئەنەس دەیگێڕێتەوە، مالیك لە (الموطأ) لەڕێی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەیگێڕێتەوە.**

**ئەوە لە حاڵەتێکدا گریمان ئەگەر عکرمە جێی متمانە نەبوو ئەوا فەرموودەکە وەك بۆمان دەرکەوت بەتەنها لەڕێی عکرمە لە ابن عباس نەهاتووە، بەڵکو بەچەند ریوایەتێك لەڕێی ئەنەس لە ابن عباس هاتووەو لەریوایەتێك لەڕێی حەسەن هاتووە بەبێ باسکردنی عکرمەو ابن عباس و لە ریوایەتێکی ترلە موعازی کوڕی جەبەل هاتووە ئەویش بەبێ ئەوەی عکرمەو ابن عباسی تیابێ، لەلای ئیمامی مالیکیش لە ڕێی زەیدی کوڕی ئەسلەم هاتووە.**

**بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر فەرموودەکە تەنها لەڕێی عکرمەوەش ریوایەت کرابا ئەوا عکرمە لەلای زۆربەی زانایانی جەرح و تەعدیل متمانەپێکراوە، ابن حبان کە ناسراوە بەوەی یەکێکە لەوانەی توندن لە جەڕح و تەعدیل کردن لە کتێبی (الثقاة) لە متمانەپێکراوەکان هەژماری دەکاو ئەو ریوایەتانە رەتدکاتەوە کە بریندارى دەکەن (سەیری: الثقاة، ابن حبان، دار المعارف العثمانية، 229/5، 230)، لە (تهذيب الكمال)ی حافیزی المزي هاتووە لە عوسمانی کوڕی حەکیم دەڵێ: دانیشتبووم لەلای ئەبو ئومامە لە کاتێکدا عکرمە هات، لێم پرسی سوێندت دەدەم بەخوا لە ابن عباس گوێت لێبووە کە وتبێتی: ئەوەی عکرمە لە منی گێڕابێتەوە باوەڕی پێبکەن چونکە ئەو درۆی بەدەم منەوە نەکردووە؟ ئەبو ئومامە وتی: بەڵێ (تهذيب الكمال في أسماء الرجال، الحافظ المزي، مؤسسة الرسالة، 1980، 271/20)، ابن أبی حاتم لە کتێبی (الجرح والتعديل) دەڵێ: سألت ابي عن عكرمة مولي ابن عباس فقال هو ثقة، قلت يحتج بحديثه؟ قال نعم إذا روى عنه الثقات (الجرح والتعديل، ابن أبي حاتم الرازي، دار إحياء التراث العربي، 8/7) واتا پرسیارم لە باوکم (واتا أبو حاتم الرازی کە یەکێکە لەگەورە زانایانی جەڕح وتەعدیل) کرد دەربارەی عکرمە خزمەتکاری ابن عباس، وتی: متمانەپێکراوە، وتم: فەرموودەی لێوەردەگیرێ؟ وتی: بەڵی ئەگەر ئەوانەی لێی ریوایەت دەکەن متمانە پێکراو بن.**

**ابن حجر لە (تهذيب التهذيب) لە محمد بن نصر المروزی دەگوازێتەوە کە وتوویەتی: "قد أجمع عامة أهل العلم بالحديث علي الاحتجاج بحديث عكرمة واتفق على ذلك رؤساء أهل العلم بالحديث من أهل عصرنا منهم أحمد بن**

**حنبل وابن راهويه ويحيى بن معين وأبو ثور" (تهذيب التهذيب، ابن حجر العسقلاني، مطبعة دائرة المعارف النظامية، 272/7) واتا: گشت ئەهلی زانست ئیجماعیان هەیە لەسەر پشت بەستن و کردنە بەڵگەی فەرموودەی عکرمە وسەرانی زانستی فەرموودە لە سەردەمی ئێمە کۆکن لەسەر ئەوە لەوانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وابن راهەویە و یەحیای کوڕی موعین و ئەبو سەور.**

**ئەوە رای گەورە زانایانی فەرموودەو زانستی جەرح و تەعدیلە لەسەر عکرمە، ئیتر هەندێ قسەی تر لەسەری و هەندێ ریوایاتی لاواز ئیعتباری بۆ دانانرێ بەرامبەر ئەو شایەتیدانە بۆ عکرمە.**

**2- فەرموودەی موعازی کوڕی جەبەل: بوخاری لە فەرموودەی ژمارە (6923) و موسلیم بە ژمارە (1733) باسی سەردانی موعازی کوڕی جەبەل بۆ لای ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لێیان رازی بێ) دەکەن کە هەردووکیان والی بوون لە یەمەن، کاتێك موعاز سەردانی ئەبو موسا دەکا پیاوێك دەبینێ بەستراوەتەوە لەلای، موعاز پرسیار دەکا ئەوە چیە؟ ئەبو موسا دەڵێ: پیاوێکی جولەکە بوو بووە موسڵمان پاشان هەڵگەڕایەوەو بووەوە بە جولەکە، ئەبو موسا بە موعاز دەڵێ دانیشە، موعاز دەڵێ دانانیشم تا نەکوژرێ، جا لە فەرموودەکەدا هاتووە موعاز وتی: "قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، ثَلاثَ مَرَّاتٍ" واتا کوشتنی حوکمی خواو پێغەمبەرەکەیەتی و سێ جار ئەو قسەیەی دووبارە کردەوە، ئەنجا جولەکەکە کوژرا. هەر ئەو فەرموودەیە لەلای نەسائی و ئەبو داود و ئەحمەدیش هاتووە.**

**3- «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ».**

**واتا: خوێنی کەسێکی موسڵمان کە شایەتی بدا بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەخوا و من پەیامبەری خوام، حەڵاڵ نابێ مەگەر بە سێ شت: زیناکاری موحصەن (پیاو ژنی هێنا بێ یا ئافرەت شووی کردبێ)، گیان بە گیان، ئەوەی ئایەنەکەی لە ئایەنەکەی وازدەهێنێ و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیادەبێتەوە.**

**ئەو فەرموودەیە لەلایەن عبدالله ی کوڕی مەسعود و دایکی باوەڕداران عائیشەو عوسمانی کوڕی عەفان (خوا لێیان رازی بێ) گێردراوەتەوە.**

**موسلیم لە عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوا لێی رازی بێ) دەیگێڕێتەوە بەژمارەی (1676)، بوخاری بە شێوەی "الْمَارِقُ مِنَ الدِّينِ التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ" بە ژمارەی (6878) دەیگێڕێتەوە، نەسائی بە ژمارە (3466) لە خاتوو عائیشەوە دەیگێڕێتەوە بە شێوە گوتەیەکی تر: "لا يحل دم امرئ مسلم إلا رجل زنى بعد إحصانه، أو كفر بعد إسلامه، أو النفس بالنفس"، ترمزی بەژمارە (1402)، هەروەها بە ژمارە (2158) لە عوسمانی کوڕی عەفان**

دەیگێڕێتەوە کاتێك لەلایەن ئاژاوەچیەکان گەمارۆدرا فەرمووودەکەی وتووە بەو شێوەیە: "لا یحل دم امرئ مسلم إلا بإحدى ثلاث: زنا بعد إحصان، أو ارتداد بعد إسلام، أو قتل نفس بغير حق فقتل به"، ئەبو داود بە ژمارە (4353) لە عائیشە دەیگێڕێتەوە بەم شێوەیە: "لا يحل دم امرئ مسلم، يشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمدا رسول الله، إلا بإحدى ثلاث: رجل زنى بعد إحصان، فإنه يرجم، ورجل خرج محاربا لله ورسوله، فإنه يقتل، أو يصلب، أو ينفى من الأرض، أو يقتل نفسا، فيقتل بها" کە لەو ریوایەتەدا تەنها باسی مورتەد نیە بەڵکو لەگەڵ هەڵگەڕانەوەی لە دین باسی حیرابەشی تیایە واتا ئەو کەسەی لە دین هەڵدەگەڕێتەوەو دەردەچی لە ریزی موسڵمانان و شەڕ لەگەڵ خوا پێغەمبەر دەکا ئەوە سزایەکەی ئەوەیە یان دەکوژرێ یان لەخاچ دەدرێ یان دووردەخرێتەوە. بەڵام ابن رجب سەبارەت بە ریوایەتەکەی عائیشە دەڵێ: "وبكلِّ حالٍ فحديث عائشة ألفاظه مختلفةٌ، وقد روي عنها مرفوعاً، وروي عنها موقوفاً، وحديثُ ابنِ مسعودٍ لفظه لا اختلاف فيه، وهو ثابت متفق على صحته" (جامع العلوم والحكم، ابن رجب الحنبلي، دار السلام للطباعة والنشر، ص347) واتا فەرمووودەکەی عائیشە وتەکانی جیاوازیان تیایە، بە مەرفوع ریوایەت کراوە (واتا دراوەتە پاڵ پێغەمبەر) وە بە مەوقوفیش ریوایەت کراوە (واتا دراوەتە پاڵ عائیشەو قسەی ئەوە نەك هی پێغەمبەر)، فەرمووودەکەی ابن مسعود وتەکانی جیاوازی تیانیە، جێگیرە و زانایان کۆکن لەسەر راست و دروستی.

ریوایەتی دووەمی ئەبو داود بە ژمارە (4502) لە عوسمانی کوڕی عەفان دەیگێڕێتەوە. ابن ماجە بە ژمارە (2533) لە عوسمان و بە ژمارە (2534) لە عبدالله دەیگێڕێتەوە. ئیمامی ئەحمەدیش لە چەند شوێنێك ریوایەتی دەکا، ئەمە بێجگە لە کتێبەکانی تر.

دوای ئەوەی فەرمووودەکانی کوشتنی مورتەدمان هێنا ئێستا چەند خاڵێك و تێبینی یەك دەخەینە بەر باس لەسەر ئەو بابەتە:

1- دیارە ئەو سزایەش هەروەك رەجم کردنی زیناکاری موحصەن باسی سزایەکی ون و جێبەجێ نەکراوە لەبەر ئەوەی دەسەڵات و دەوڵەتێکی ئیسلامی نیە کە گشت ئەحکامی شەریعەت جێبەجێ بکا، بۆیە ئەو سزایە تەنها لەلایەن قازی و حاکمێکی شەرعی لەسایەی دەوڵەت و کۆمەڵگایەکی ئیسلامی و دوای دادگایی کردن و سەلماندنی تاوانەکە و داواکردنی گەڕانەوە لە تاوانبار (استتابة) جێبەجێ دەکرێ، کە ئێستاش ئەوە لەئارادا نیە بۆیە کەس ناتوانێ ئەو حوکمە لەلایەن خۆیەوە جێبەجێ بکا.

2- کوشتنی مورتەد پێچەوانە نیە لەگەڵ ئایەتی ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ البقرة: 256، ئەو ئایەتە باس لەوانە دەکا کە لە بنەچەوە موسڵمان نین و لەسەر ئاینێکی ترن، لێرەدا ئیسلام زۆریان لێناکاو ئازادی

تەواویان هەیە لە مانەوە لەسەر ئاینەکەی خۆیان و ئەنجامدانی دروشم و پەرستشەکانیان. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەش یەکێك لە رایەکان ئەوەیە پێش هاتنی ئیسلام هەندێ لەئافرەتانی ئەنصاریەکان نەزریان دەکرد ئەگەر منداڵەکانیان گەورە ببن و نەمرن ئەوا دەیانکەنە جولەکە، جا کاتێك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) هۆزی بەنی نەزیری جولەکەی دەرکرد لە مەدینە هەندێ لە رۆڵەکانی ئەنصاریەکانی تیا بوو، ئەوانیش وتیان ناهێڵین رۆڵەکانمان لەگەڵ ئەوان بڕۆن و ویستیان زۆریان لێبکەن تا بگەڕێنەوە بۆ ناو ئیسلام، لەو کاتەدا ئایەتەکە هاتە خوارەوە کە قەدەغەی ئەو کارە دەکاو روونی دەکاتەوە کە زۆرکردن لە ئایندا نیە (سەیری: تفسیر الطبري، دار هجر للطباعة والنشر، 546/4)، هەر چەندە لەفزو گوتەی ئایەتەکە گشتیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هۆی هاتنە خوارەوەکەی زیاتر تیشك دەخاتە سەر بابەتەکە بەوەی تەنها ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە بنەچەدا موسڵمان نین نەك ئەوانەی کە بە ئازادی خۆیان ئیسلامیان هەڵبژاردووە پاشان لێی پاشگەز دەبنەوە، چونکە ئەوەی بە ئارەزووی خۆی ئیسلامی هەلبژاردووە دەبێ ئەوەش بزانێ کە لە ئیسلامدا حوکمی هەڵگەڕانەوە لە ئاین بریتیە لە کوشتن لەسەر ئەو ئەساسە ئەو ئاینەی قبوڵ کردووە.

3- لەگەڵ ئەوەی لە ئیسلامدا زۆرلێکردن نیەو خاوەن ئاینەکانی تر لەسایەی دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامیدا ئازادن و زۆریان لێناکرێ بۆ هاتنە ناو ئیسلام، بەڵام لە هەمان کاتدا موسڵمانانیش لەوە ئازادن کە عەقیدەو بیروباوەڕی خۆیان بپارێزن و ئیسلام رێ نادا بەوەی ئاین ببێتە گەمەو گاڵتە وەك ئەوانەی خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا ﴾ الأعراف: 51، و ناکرێ هەر یەکێك کە بە ئازادی خۆی ئیسلامی هەڵبژاردبوو لە دینەکەی هەڵبگەڕێتەوەو کۆمەڵگای ئیسلامی دووچاری ئاژاوەو کێشە بکا و تانە لە بیروباوەڕی موسڵمانان بداو ببێتە هاندەرێك بۆ کەسانی تریش کە لە دین هەڵبگەڕێنەوە، هەروا بە ئاسانی وازی لێبهێنرێ و سزا نەدرێ، چونکە ئەوە جۆرێکە لە دەرچوون لە یاسای دەوڵەت کە هیچ دەوڵەتێك رێگە بەوە نادا هاوڵاتیانی لە یاسا دەرچن.

لەسەر ئەو باسە زانای تونسی گەورە الطاهر بن عاشور روونکردنەوەیەکی جوان دەدا و دەڵێ: "وحكمة تشريع قتل المرتد مع أن الكافر بالأصالة لا يقتل أن الارتداد خروج فرد أو جماعة من الجامعة الإسلامية فهو بخروجه من الإسلام بعد الدخول فيه ينادي علي أنه لما خالط هذا الدينَ وجدَه غير صالح ووجد ما كان عليه قبلَ ذلك أصلح فهذا تعريض بالدين واستخفاف به" (التحرير والتنوير، محمد الطاهر بن عاشور، دار سحنون للنشر والتوزيع، 336/2) واتا: حیکمەتی دانانی کوشتنی مورتەد لەگەڵ ئەوەی کافر لە بنەچەدا ناکوژرێ لەبەر ئەوەیە کە هەڵگەڕانەوە دەرچوونی تاکێك یا کۆمەڵێکە لە کۆمەڵی موسڵمانان بەو دەرچوونەشی لە ئیسلام دوای ئەوەی هاتە ناویەوە بانگەشەی ئەوە دەکا کاتێك تێکەڵ بەو دینە بوو بینی دینێکی گونجاو و لەبار نیەو ئەوەی پێشتر لەسەری بوو باشترو چاکترە کە ئەوەش تانەدان و بەکەم زانینی ئەو دینەیە.

4- مورتەد یەکسەر ناکوژرێ بەڵکو دەبێ داوای لێبکرێ کە بگەڕێتەوە بۆ باوەشی ئیسلام و تەوبە بکا، واتا ئیستیتابە بکرێ کە زۆربەی زۆری زانایان دەڵێن واجبەی نابێ بەبێ ئیستیتابە بکوژرێ، ماوەی ئەو داواکردنەش بۆ تەوبە کردن راجیاوازی لەسەرە لە نێوان زانایان، رای زۆربەی زانایان (جمهور) ئەوەیە کە ماوەی سێ رۆژ داوای گەڕانەوەی لێدەکرێ، لە یەکێك لە ریوایەتەکانی فەرموودەکەی موعازی کوڕی جەبەل و ئەبو موسای ئەشعەری گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێ: "ونحن نريده علي الإسلام منذ، قال: أحسبه، شهرين" واتا وای بۆچووم کە ماوەی دوو مانگە داوای لێدەکەین بگەڕێتەو بۆ ناو ئیسلام، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە 20 رۆژ داوای لێکراوە، لە عەلی کوڕی ئەتالیب هاتووە کە ماوەی مانگێك داوای لە پیاوێك کردووە بگەڕێتەوە، ابن قدامە قەولێکی نەخەعی دێنێتەوەو دەڵێ: "وَقَالَ النَّخَعِيُّ: يُسْتَتَابُ أَبَدًا" (المغني لابن قدامة، مكتبة القاهرة 6/9) واتا بە هەمیشەیی داوای گەڕانەوەی لێدەکرێ.

لەمەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە ئیستیتابەو داوای گەڕانەوە واجبە بەڵام زانایان کۆك نین لەسەر یەك را، ئەوەش بوارێك دەهێڵێتەوە بۆ ئیجتهاد کردن لەو مەسەلەیەو دەگەڕێتەوە سەر تەقدیرو خەمڵاندنی قازی و دەسەڵاتدارو زانایان، کە دەکرێ ماوەکەی بۆ درێژ بکرێتەوە تا ماوەی چەند مانگێك و کەسی هەڵگەڕاوە لەشوێنێك دەستبەسەرو بەند بکرێ و ئامۆژگاری بکرێ و بانگخوازان و زانایانی پسپۆر بچنە لای بۆ ئەوەی بزانن گومانەکانی چین کە وای لێکردووە هەڵبگەڕێتەوە لە ئیسلام تا بیڕەوێننەوەو وەڵامی پرسیارەکانی بدەنەوە، ئەگەر هەر نەگەڕایەوە بۆ ئیسلام ولەسەر کەللەڕەقی خۆی بەردەوام بوو ئەوا پێی دەوترێ کە حوکمت کوشتنە ئەگەر پەشیمان نەبیەوە، جا کەسێك دوای ئەوە هەر نەگەڕایەوەو لەسەر کەللەڕەقی خۆی سوڕ بوو و ئامادەی کوشتن بوو بەس نەگەڕێتەوە بۆ باوەشی ئیسلام ئەگەر تەنها بە زمانیش بێ - چونکە کاتێك بە زمان پەشیمان بوویەوەو شایەتی هێناو گەڕایەوە بۆ ئیسلام ئەگەر لە دڵەوەش هەر بێ باوەڕ بێ ئەوا مامەڵەی موسڵمانی لەگەڵ دەکرێ چونکە بێجگە لە خوا کەس ئاگاداری دڵ نیەو کەس ناتوانێ حوکم بدا لەسەر ئەوەی لەناو دڵدایە - ئەوا موستەحەقی کوشتنەو دەبێ کۆمەڵگای ئیسلامی لەو جۆرە کەسانە پاك بکرێتەوە.

5- مورتەد تەنها یەك جۆری نیە، بەڵکو دەتوانین بیکەینە سێ جۆر، جۆرێکیان ئەوەیە کە تەنها لە دڵەوە لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوەو بە زمان راینەگەیاندووەو کەس پێی نەزانیوە، دیارە حوکمی ئەوە وەك حوکمی دووڕوو (منافق) وایە کە مامەڵەی موسڵمانی لەگەڵ دەکرێ چونکە دڵ تەنها خوا پێی ئاگادارە، لە سەردەمی پێغەمبەریشدا (درودی خوای لەسەر) هیچ کام لە موناڤیقەکانی نەکوشت لەبەر ئەوەی لەسەرەوە خۆیان وەك موسڵمان نیشاندەدا.

جۆری دووەم ئەوەیە کە هەڵدەگەڕێتەوە لە ئیسلام و رایدەگەیەنێ بەڵام بانگەشە بۆ بیروڕاکانی ناکا و بەبێ دەنگی لە ماڵی خۆی دادەنیشێ و هیچ زەرەرێکی نیە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی.

جۆری سێیەم ئەو کەسەیە هەڵدەگەڕێتەوە لە ئیسلام و بەوە ناوەستێ کە تەنها رایبگەیەنێ بەڵکو بانگەشە بۆ بیروڕاکانی خۆی دەکاو بە ئاشکرا تانە لە ئیسلام دەداو هانی کەسانی تر دەدا کە هەڵبگەڕێنەوە.

جا لێرە بەشێك لە زانایانی هاوچەرخ جیاوازی دەکەن لە نێوان حوکمی جۆری دووەم و سێیەم، دەڵێن جۆری دووەم لەبەر ئەوەی هیچ زەرەرێکی نیەو بێ باوەڕیەکەی تەنها بۆ خۆیەتی حوکمی کوشتنی نیە بەڵکو ئامۆژگاری دەکرێ و گومانەکانی بۆ دەڕەوێنرێتەوە، حوکمی کوشتن تەنها لەسەر جۆری سێیەمە.

هەندێ لە زانایان دەڵێن فەرموودەکەی عبدالله ی کوڕی مەسعود (التارك لدينه المفارق للجماعة) روونکەرەوەیە بۆ فەرموودەی (من بدل دينه فاقتلوه) واتا کوشتن تەنها لەسەر ئەو کەسەیە کە بە قسەو کرداری لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بێتەوەو بە ئاشکرا هەڵبگەڕێتەوەو بانگەشە بۆ بیروڕاکانی بکا، بەڵام وەسفی (المفارق للجماعة) نابێتە بەڵگە بۆ ئەمە چونکە هەر کەسێك لە ئیسلام پاشگەز بۆوە ئەوا بێگومان لە کۆمەڵی موسڵمانان جیابۆتەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ جیاکاریەك بکرێ لەنێوان ئەو دوو جۆرەی هەڵگەڕانەوە، زانای گەورە شێخ یوسف قەرەزاوی وەك لە کتێبی (جريمة الردة وعقوبة المرتد في ضوء القرآن والسنة) روونی دەکاتەوە رای وایە کە موڕتەد ئەگەر بانگەشەی بۆ بیروڕاکانی نەکرد و زەرەرەکەی تەنها بۆ خۆی بوو ئەوا دەکرێ بگەڕێینەوە سەر رایەکەی نەخەعی کە یەکێکە لە تابیعیەکان و زانایەکی حیساب بۆ کراوەو، هەمیشە داوای گەڕانەوەو تەوبەی لێ بکرێ و نەکوژرێ بەڵام بەند بکرێ، بۆ پشتگیری ئەو رایە و نەکوشتنیان بەڵکو تەنها بەند کردنیان ئەسەرێك هەیە لە ئیمامی عومەر کە دەکرێ پشتی پێ ببەسترێ، کاتێك ئەنەسی کوڕی مالیك لە فەتح کردنی شاری (توستەر) دەگەڕێتەو عومەر لێی دەپرسێ: ئەو شەش کەسەی لە هۆزی بەکر کوڕی وائیل کە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و چوونە ریزی بتپەرستەکان چیانکرد؟ ئەنەس دەڵێ: ئەی ئەمیری بڕواداران لە شەڕدا کوژران، ئیمامی عومەر دەڵێ: إنا لله وإنا إليه راجعون، ئەنەس دەڵێ: ئەی ئەمیری بڕواداران هیچ رێگایەکی تر هەبوو بێجگە لە کوشتنیان؟ لە وەڵامدا ئیمامی عومەر دەڵێ: "نَعَمْ، كُنْتُ أَعْرِضُ عَلَيْهِمْ أَنْ يَدْخُلُوا فِي الْإِسْلَامِ، فَإِنْ أَبَوَا اسْتَوْدَعْتُهُمُ السِّجْنَ" واتا بەڵێ عەرزم دەکردن کە بێنە ناو ئیسلام، ئەگەر رازی نەبوان ئەوا دەمخستنە بەندینخانە (السنن الكبرى للبيهقي، 16888، دار الكتب العلمية، 359/8).

والله أعلم..